**مەسەلەی چـــوارەم:**

**هەروەهـا بلـێ: سـتایش بۆ ئـەو خوایەی ڕۆڵـەی نیەو، هاوبـەشی نیە لە موڵك و دەسـتەڵات داو، لەبـەر بـێ دەسـتەڵاتیی پەنـای بـۆ هیـچ پشـتیوانێك نەبـردوەو، بـە گەورەگرتنێکی شایسـتە بـە گـەورەی بگرە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾ ﴾.

## شکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، هەروەها بلێ: ستایش هەمووی بۆ خوایە.

ئێمـە چەمـك و واتـای وشـەی (**حمد**)مـان لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (**الفاتحـة**) و (**الأنعـام**) و (**سـبأ**) و (**فاطر**)یـش دا، بەدرێژیـی ڕوون کردۆتـەوە، کـە پوختەکـەی بریتیـە لـە: مـەدح و سـەنای خـوا و باسـکردنی نـاوو سیفەتە بـەرز و بـێ وێنـەکانی.

٢)- ﴿ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا ﴾، ئەو خوایەی کە هیچ ڕۆڵەی نیە، ڕۆڵەی بۆ خۆی دانەناوە، (**اتخذه: أي: صَيَّرَهُ، والإتخاذ افتعال من الأخذ**) (**أخذ**) یانی گرتن، (**إتخاذ**)یش (**إفتعال**)ە، لە (**أخذ**)ەوە یانی: هەڵبژاردن.

٣)- ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ ﴾، هەروەها لە موڵك و دەستەڵاتیشیدا هاوبەشی نین.

هاوبەشـدانەران دەیانگـوت: خـوا ڕۆڵـەی هەیـە، کـە هەندێکیـان دەیانگـوت: شـەیتانەکان کـوڕانی خـوان و، فریشـتەکان کچـانی خـوان، بۆیـە خـوا لێرەدا: وشـەی (**ولـد**)ی بەکارهێنـاوە، کـە بـۆ کـوڕ (**ابـن**) و کـچ (**بنت**)یـش دەبـێ، واتـە: خـوا هیـچ ڕۆڵـەی نیـە.

هەروەها هاوبەشیشی نیە لە موڵك و دەستەڵات و خاوەندارێتیی دا.

٤)- ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ﴾، بە هۆی بێ دەستەڵاتییشیەوە، پەنای نەبردۆتە بەر هیچ پشتیوان و هاوکارو سەرخەرێك.

وشـەی (**مِـن**)، لـە (**مـن الـذل**)دا، (**بمَعْنَـى لام التَّعْلِيـلِ**)، یـانی: بـە هـۆی ملکەچیـی و بـێ دەسـتەڵاتییەوە، پێویسـتیی بـە سەرپەرشـتیارو دۆسـت و پشـتیوان نەبـووە.

**(الذل): العَجْزُ وَالإِفْتِقَار، وَهُوَ ضِدُّ العِزِّ أي: لَيْسَ لَهُ نَاصِرٌ مِنْ أَجْلِ الذُّلِّ، وَالمُرَادُ نَفِي النَّاصِرِ لَهُ عَلَى وَجْه مُؤَكِّدٍ، فَإِنَّ الحَاجَّة إِلى النَّاصِرِ، لاَ تُكُونُ إِلاَّ مِنَ العَجْزِ عَنِ انْتِصَارِ للنَّفْسِ)**، واتە: مانای (ذلّ) دەستەپاچەیی و ئاتاجیی یە و، پێچەوانەی (عِزّ)ە، واتە: باڵادەستیی، زاڵیی، واتە: خوا پێویستیی بە هیچ یارمەتییدەرو هاوکارێك نەبووە، بە هۆی بێ دەستەڵاتییەوە، یانی: خوا هیچ هاوکارێکی نەبووە، چونکە پێویستیی بە هاوکارو پشتیوان بۆ کەسێکە، دەستەپاچە بێ و بەرگریی پێ لە خۆی نەکرێ، بەڵام خوا دەستەڵاتیی بێ سنوورو ڕەهای هەیە.

٥)- ﴿وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾، بە گەورەی بگرە (خوای بەرزی مەزن) بە گەورەگرتنێکی شایستە.

**(تكبيراً: مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ للتأكِيدِ، إعْتَقِدِ أَنَّهُ كَبِيرٌ، أي: عَظِيمٌ العِظَمَ المَعْنَويَّ الشَّامِلِ لوجُوبِ الوجُودِ، والغِنَى المُطْلَقِ)**، واتە: **(تكبيراً)** بەرکاری ڕەها **(مفعولٌ مطلق)**یە بۆ جەختکردنەوە، بڕوات وا بێ کە خوا مەزنە، گەورەییەکی مەعنەویی گشتگیر، کە خاوەنی بوونێکی پێویستە و، خاوەنی بێ نیازیی دەوڵەمەندییەکی ڕەهاو بێ سنوورە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە خوا بە یەکگرتنی تەواو **(التوحيد الكامل)** لە عەقڵ و دڵیاندا دەچەسپێ و، لە ژیانی ڕۆژانەیاندا: خوا بە تەنیا پەرستن و خوابەیەکگرتن، بەباشترین شێوە تێگەیشتنی بەرجەستە دەبێ و، خوا بە کەرەمی خۆی زیاتر بەهرەمەندمان بکات بە هۆی ئیمانی باشترەوە، لە فەرمایشتی بەرز و مەزن و بێ وێنەی خۆی: قورئانی بەرز و بەپێز.

لێرەدا کۆتایی بە شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستەکانی سوورەتی **(الإسراء)**ە دێنین.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

**٥/ ذو القعدة/ ١٤٣٨ ك**

**٢٠١٧/٧/٢٨ ز**

# نێـوەڕۆک